# کورتکراوەی بنچینەکانی دەرمان

## چەند پێناسەیەکی گرنگی بواری دەرمانسازی

دەرمان ماددەیەکە بەکاردێت بۆ چارەسەری نەخۆشی یان خۆپاراستن لە نەخۆشی .

پێکهاتووە لە ماددەیەکی کیمیایی یان سروشتی، کاریگەری لەسەر ئەو زیندەوەرانە دروست ئەکات کە ئەچنە جەستەی مرۆڤەوە.

### کاتێك دەرمانێك ئەخورێت دوو جۆر کاریگەری هەیە:

#### 1. Pharmacokinetics

کاریگەری لەش لەسەر دەرمان ( لەش چی بەسەر دەرماندا ئەهێنێت کاتێك ئەخورێت )

کاریگەرییەکانی لەش لەسەر دەرمان چوار قۆناغە:

1. **Absorption**
2. **Distribution**
3. **Metabolism**
4. **Excretion**

#### 2. Pharmacodynamics

کاریگەری دەرمان لەسەر لەش( دەرمان چی بەسەر لەشدا ئەهێنێت کاتێك کە ئەخورێت)

2024



# کورتکراوەی بنچینەکانی دەرمان

## Some things about meditation that you should know




## 1. Name Of The Medication

1) Generic Name ناوی زانستی
2) Trade Name ناوی بازرگانی
3) Chemical Name ناوی کیمیایی

پێویستە ناوی زانستی و ناوی بازرگانی دەرمان بزانین بەتایبەتی ناوی زانستی چونکە ناوی زانستی دەرمان ناوێکی نەگۆڕە و پێویستە هەموو کۆمپانیایەکی دەرمان ناوی زانستی دەرمانەکە بنوسێت بەڵام ناوی بازرگانی ناوێکی گۆڕاوە واتا هەر کۆمپانیایەك بۆ خۆی ناوێکی بازرگانی ئەبەخشێت بەدەرمانێك.

## 2. Unit Of Medication

1)1g=1000mg
2)1CC=1ml
3)1L=1000CC or ml
4)1CC=100 Iu (International unit)

Iu یەکەیەکە بەکاریەت بۆ ئەو دەرمانانەی کە بە بڕێکی کەم کاریگەریەکی گەورە دروست ئەکات



# کورتکراوەی بنچینەکانی دەرمان

## Some things about meditation that you should know

### 3. An important note:

**No medication may be given to a patient without a medication order from licensed practitioner.**

تێبینییەکی گرنگ: بەهیچ شێوەیەك نابێت هیچ دەرمانێك بدرێت بە نەخۆش کە لە فایلی نەخۆشەکەدا نەبێت وە مۆڵەتی پزیشکی لەسەر نەبێت (بەبێ مۆڵەتی ئەو پزیشکەی کە پلەی لە تۆ بەرزتربێت)

### 4. medication uses بەکارهێنانەکانی دەرمان

**Medication is used for three main purpose**

دەرمان بۆ سێ مەبەستی سەرەکی بەکارئەهێنرێت

## 1) Prophylactic

بەکاریەت بۆ ڕێگریکردن لە نەخۆشی واتا پێش ئەوەی توشی نەخۆشیەکە ببێت دەرمان وەرئەگرێت بۆ ئەوەی توشی نەخۆشیەکە نەبێت وەك دەرزی کوتان و ڤاکسین.

## 2) Therapeutic

بۆ چارەسەری نەخۆشی بەکاریەت کاتێك کەسەکە توشی نەخۆشیەکە بوبێت

## 3) Diagnostic

بۆ دەستنیشانکردنی نەخۆشی بەکاریەت



# کورتکراوەی بنچینەکانی دەرمان

**Some things about meditation that you should know**

## 5. Drug Interactions

**Don't mix any medication except tow situations:**

بەهیچ جۆرێك دەرمان تێکەڵ ناکرێت تەنها لە 2 حاڵەتدا نەبێت ئەوانیش :

### 1) Antagonist Effect کاریگەری پێچەوانە

حاڵەتێکی کیمیاییە کە یەك دەگرێت لەگەڵ وەرگرەکانی لەش و چالاکی کەم ئەکات.

بۆ نموونە: هەر کاتێك دەرمانێکت بەهەڵە دا بەنەخۆش دواتر دەرمانێکی تر پێدا بۆ ئەوەی ئەو هەڵەیە ڕاست بکەیتەوە.
یان ئەگەر کەسەکە شتێکی خوارد و پەستانی خوێنی پێ بەرزبووەوە ئەوا دەرمانێکی پێ ئەدەین بۆ ئەوەی پەستانی خوێنەکەی دابەزێت.

### 2) Synergistic effect کاریگەری هاوتەریب

کاتێك دەرمانێك ئەدەی بە نەخۆش و پاش دەرمانێکی تری پێ ئەدەی بۆ ئەوەی کاریگەرییەکی زیاتر بێت.

بۆ نموونە: ئەو کەسانەی توشی نەخۆشی ئایدز بوون لەڕۆژێکدا ئەبێت چەند دەرمانێك بەیەکەوە بخۆن بۆ ئەوەی کاریگەری ڤایرۆسەکە کەمبکەنەوە.



# کورتکراوەی بنچینەکانی دەرمان

Some things about meditation that you should know

## 6. Rights

**Six Rights Ensure Safety in Giving Medication**

ئەم شەش ڕاستیە ئەبێت وەك ناوی خۆت بیزانی:

1)**Right patient**

2)**Right drug**

3)**Right time**

4)**Right dosage**

5)**Right route**

6)**Right effect**

## 7. Medication Forms

شێوەکانی دەرمان بەگشتی پۆلێن ئەکرێن بۆ سێ کۆمەڵە:

1) شل **Liquid**

2) ڕەق **Solid**

3) نیمچە ڕەق **Semi Solid**

**Forms: Capsule, Tablet, Ointment**

## 8. Route For Administering Drugs ڕێگاکانی وەرگرتنی دەرمان

1) **Oral Route**

2) **Topical Route**

3)**Parenteral Route**

4)**Pulmonary Route**



2024

گروپی پەرستار/ Nurse

# کورتکراوەی بنچینەکانی دەرمان

## Some things about meditation that you should know




چۆنێتی تێگەیشتن لە ڕەچەتەی پزیشکی **RX**

1)ناوی دەرمانەکە ئەنوسرێت

2)ژەمی دەرمانەکە ئەنوسرێت

3)شێوەی دەرمانەکە دیاری ئەکات **ampul** یان **Tab**

4)بڕی پێویست دیاری ئەکات کە چەند دانە وەربگرێت

5)دیاری ئەکات ڕۆژی چەند جار وە چ کاتێك ئەو دەرمانە بەکاربێنێت



# کورتکراوەی بنچینەکانی دەرمان

## هەندێك وشەی گرنگ لەبواری دەرمانزانیدا کەپێویستە بیانزانیت

### 1. Indication (pharmacological use)

بەکارهێنانی دەرمان واتە ئەم دەرمانە بۆ کێ بەکاریەت وە بۆ چ حاڵەتێکی نەخۆشی بەکاریەت.

### 2. Side effect

واتە کاریگەری لاوەکی ئەم دەرمانە چییە یان چ زیانێکی هەیە، چونکە هیچ دەرمانێك نییە بێ زەرەر و زیان بێت.

### 3. Contraindication

واتە ئەم دەرمانە بۆ کێ بەکارنایەت، بەواتای ئەوە یەت ناتوانین هەموو دەرمانێك بۆ هەموو کەسێك بەکاربهێنین بۆ نموونە ڤۆڵتارین بۆ کەسێك بەکارنایەت کە زەختی خوێنی هەبێت یان بۆ کەسێك برینی گەدەی هەبێت.

### 4. Dose

بریتیە لەو بڕە دەرمانەی کە پێویستە بدرێ بە نەخۆش بۆ نموونە بڕی 30ملگم بۆ هەر کیلۆیەك لە پێدانی ڤیالی **Amoxicillin**.

### 5. Composition of drug

واتە ئەم دەرمانە لەچی پێکهاتووە

### 6. Mechanism of action

واتە ئەم دەرمانە بە چ شێوازێك ئیش ئەکات

### 7. Drugs interaction

واتە ئەو دەرمانەی نەخۆش وەریئەگرێت لەگەڵ کام دەرمانی تر ئەگەری هەیە کارلێك بکات و کاریگەرییەکی ئاڵۆز دروست بکات بۆ جەستە.



# کورتکراوەی بنچینەکانی دەرمان

## هەندێك وشەی گرنگ لەبواری دەرمانزانیدا کەپێویستە بیانزانیت

### 8. Onest of action

ئەو کاتەیە کە کەسێك دەرمانێك ئەخوات تا ئەو کاتەی کە کاریگەرییەکی دەرئەکەوێ.

### 9. Bioavailability

بریتیە لە ڕێژەی دەرمانی بەردەست لە سوڕی خوێن

### 10. Pregnancy and lactation

واتا ئایا ئەم دەرمانە بۆ ئافرەتی دووگیان و دایکی شیردەر ئەگونجێت.

دەرمانەکان دابەش ئەکرێن بەسەر چەند جۆریکدا:

**Category A:**

لەم حاڵەتەدا سەلمێنراوە کە دەرمانەکە هیچ زیانێکی نییە.

**Category B:**

لەسەر ئاژەڵ تاقیکراوەتەوە زیانی نەبووە لەسەر کۆرپەلە بەڵام لەسەر مرۆڤ تاقینەکراوەتەوە، بۆیە پێویستە بە وریاییەوە بەکاربهێنرێت.

**Category C:**

لەسەر ئاژەڵ تاقیکراوەتەوە زیانی هەبووە لەسەر کۆرپەلە بەڵام لەسەر مرۆڤ تاقینەکراوەتەوە، بۆیە ئەم دەرمانە کاتێك بەکارئەهێنرێت کە پێوسیت بێت و هیچ جێگرەوەیەکی نەبێت هەروەها سوودەکەی زیاتر بێت لە مەترسییەکەی.

**Category D:**

ئەم جۆرەیان مەترسی هەیە لەسەر لەناوچونی کۆرپەلە تەنها لە حاڵەتێکدا بەکارئەهێنرێت کە ژیانی دایکەکە بپارێزێت.

**Category X:** بەکارنایەت لەکاتی دووگیانی



2024

# کورتکراوەی بنچینەکانی دەرمان

## کاتەکانی پێدانی دەرمان

کاتێك کە کەسێك نەخۆشە و لەنەخۆشخانە هەندێك دەرمانی بۆ نوسراوە، لەسەر دەرمانەکان چەند خەتێکی پێوەیە ئەم خەتانە مانای چییە؟




1×1
لە رۆژێکدا 1 جار

1×2
لە رۆژێکدا 2 جار

1×3
لە رۆژێکدا 3 جار




1×4
لە رۆژێکدا 4 جار

1×6
لە رۆژێکدا 6 جار

ئەو کاتەی پێوسیتت پێ بوو ئەو کاتە بەکاری بێنە، **On Need**.

**8. Onest of action**



# کورتکراوەی بنچینەکانی دەرمان

## ئەم خشتەیە پێی ئەوترێت Medication Timetable

بۆ زیاتر تێگەیشتن سەیری ئەم خشتەیەی خوارەوە بکە.
ئەم خشتەیە زۆر گرنگە وە پێوسیت زانیاریت لەسەر ئەم جۆرە خشتەیە هەبێت.
ئەم خشتەیە پێی ئەوترێت Medication Timetable or medication Schedule or Medication chart or medication record

## Parts of the medication Order:

1 Patients name
2 Date and time the order is written
3 Name of drug to be administered
4vDosage of the drug
5 Route by which the drug is to be administered
6 Frequency of administration of the drug

| | | | |
|---|---|---|---|
| Name: | Age: | Gender: | Date: / / |
| Diagnosis: | ID: | ABO: | Date of Admission: / / |

| Medication Name | Dosage | Route | Frequency | 12 Am | 2 Am | 4 Am | 6 Am | 8 Am | 10 Am | 12 Pm | 2 Pm | 4 Pm | 6 Pm | 8 Pm | 10 Pm |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| Hyfresh® eye drop | 2 Drops | Eye Drop | 1×6 | ✓ | | ✓ | | ✓ | | ✓ | | ✓ | | ✓ | |
| Viscotears® eye gel | — | Eye Gel | O.N {on need} | | | | | | ✓ | | | | | | |
| Ventolin® Nebulizer | 2.5mg | Neb | 1×4 | ✓ | | | ✓ | | | ✓ | | | ✓ | | |
| Ceftriaxone vial | 1g | IV | 1×2 | | | | | | ✓ | | | | | | |
| Paracetamol tab | 500mg | Oral | 1×3 | ✓ | | | | ✓ | | | | ✓ | | | |
| Aspirin® Tab | 100mg | Oral | 1×1 | | | | | | | ✓ | | | | | |



# کورتکراوەی بنچینەکانی دەرمان

## چەند تێبینییەك

1) لەکاتی دەرمان پێدانیدا شەش ڕاستیەکە لەبیر مەکە، شەش ڕاستی بۆ دڵنیابوون لە سەلامەتی لە کاتی پێدانی دەرمان:

نەخۆشی ڕاست: بزانە ئەو نەخۆشەی کە ئەتەوێ دەرمانی پێبەی نەخۆشە ڕاستەکەیە

دەرمانی ڕاست: دڵنیا بەرەوە کە دەرمانە ڕاستەکە ئەدەی بە نەخۆش

کاتی ڕاست: ئەبێت ئەو دەرمانەی کە بۆی نوسراوە لە کاتی دیاریکراودا وەریبگرێت

ژەمی ڕاست: دڵنیا بەرەوە لەو بڕە دەرمانەی کەبۆی نوسراوە

ڕێگای ڕاست: ئەو دەرمانە بەکام ڕێگا ئەیەیت بە نەخۆش لەڕێگای دەرزی یان دەم

کاریگەری ڕاست: دڵنیا بەرەوە لەوەی کە درمانەکە کاریگەری باشی ئەبێت

2) On Need

لەم چارەسەرە هیچ کاتێکی بۆ دیاری ناکرێت لەو کاتەدا نەخۆش وەریئەگرێت کە پێویستی پێبێت وە لەسەر Medication Record ەکە کاتەکەی دیاری ئەکەیت کە چ کاتێك نەخۆشەکە دەرمانەکەی وەرگرتووە.

3) 1×2

بۆ ئەم چارەسەرە بەجۆرێك کاتەکەی دابنێ کە بۆ نەخۆش کاتێکی گونجاو بێت وە کاتێك دەرمانت بە نەخۆشەکە دا پێویستە لەکاتی بەرامبەر پێی بدەی بۆ نموونە سەعات 10ی نیوەڕۆ دەرمانەکەت بەنەخۆش داوە ئەوا ئەبێت سەعات 10ی شەو دوبارە دەرمانەکەی پێبدەی

4) هەر کاتێك خشتەی دەرمانت دانا ڕەچاوی دو شت بکە:

1)ژیانی نەخۆشەکە بۆ نموونە چ کاتێك ئەخەوێت

2)ڕەچاوی دەرمانەکە بکە. بۆ نموونە دەرمانەکە ئەبێت بەشەو بدرێت ناکرێ بەڕۆژ دەرمانەکە وەربگرێت



# کورتکراوەی بنچینەکانی دەرمان

## چەند تێبینییەك

5) پێویستە لەکاتی دەرزی لێدان وریای ئەم خاڵانەی خوارەوە بیت:
1) وریابیت دەزییەکە لەڕێی **IV** ئەدرێت بە نەخۆش یان **IM**
ئەگەر دەرزییەکە نوسرابوو **Only IV** ئەوا نابێت بە **IM** بیکەیت و ئەبێت بە **IV** بیکەیت
ئەگەر دەرزییەکە نوسرابوو **IV or IM** ئەوا بەدڵی خۆت بەکام رێگایە ئەیکەیت
ئەگەر نوسرابوو **Only IM** ئەوا تەنها ئەبێت لەڕێگەی دەرزی ماسولکەوە بێت
2) ئەبێت سەیری بەرواری بەسەرچونەکەی بکەیت

6)کاتێك دکتۆر وتی پێش نان خواردن واتا ئەبێت 20 بۆ 30 خولەك پێش نان خواردن بخورێت

7)کاتێك دکتۆر وتی دواى نان خواردن واتا ئەبێت 20 بۆ 30 خولەك دواى نان خواردن بخورێت

## شێوازەکانی درمان

| | | | |
|---|---|---|---|
| دەرزی تۆز | **Vial** | مەڵحەم | **Ointment** |
| دەرزی گیراوە | **Ampule** | کرێم | **Cream** |
| حەب | **Tablet** | قەترە | **Drop** |
| کەپسول | **Capsule** | سپڕا | **Spray** |
| تەحامیل | **Suppositories** | شروب | **Syrup** |
| پاودەر | **Powder** | شامپۆ | **Shampoo** |
| جێڵ | **Gel** | هەڵمژین | **Inhaler** |
| لەزگە | **Patch** | دەرزی | **Injection** |



2024

# کورتکراوەی بنچینەکانی دەرمان

## Factors influencing drug action

ئەو هۆکارانەی کاریگەری ئەکەنە سەر کاری دەرمانەکە:

1) **Age**
2) **Body weight**
3) **physical condition**
4) **Route**
5) **Time**
6) **Addiction**
7) **Metabolism and Excretion**

دوای هەڵپچڕینی دەرمان دەبێت چەنێك بەکاربهێنرێت:

شروبی گیراوە 20 بۆ 30 ڕۆژ
شروبی تۆز 5 بۆ 10 ڕۆژ
قەترەی گوێ 14 بۆ 21 ڕۆژ
قەترەی لوت 45 بۆ 90 ڕۆژ
قەترەی چاو 20 بۆ 30 ڕۆژ
کرێم و مەلحەم 2 بۆ 3 مانگ
دەرزی وایاشترە نەگاتە 12 سەعات

## کورتکراوە باوەکان

**H.S= Hora sommi , At Bed Time**
**N.P.O= Nor Par Os , Nothing By Mouth**
**P.O= Par Os , By Mouth**

**BID= Bis In Die , 2 Time Per Day**
**TID= Ter In Die , 3 Time Per day**
**QID=Quatre In Die , 4 time Per Day**
**PRN= Pro Re Nata , On Need**



**2024**

# کورتکراوەی بنچینەکانی دەرمان

## Differences between Cream and Ointment

## جیاوازی نێوان کرێم و مەڵحەم

## کرێم Cream

1)تێکەڵەیەکە نیوەی لە ئاو نیوەکەی تری لە ڕۆن پێکهاتووە
2)چڕی کەمترە و بەئاسانی بڵاوئەبێتەوە بە ناوچەیەکی فراواندا
3)لەبەر ئەوەی ئاو زۆرە لە پێکهاتەکەیدا بەخێرایی لەلایەن پێستەوە هەڵدەمژێت و وشك ئەبێتەوە باشتر وایە بۆ پێستی چەور بەکاربهێنرێت
4)کرێم زیاتر لەسەر چینی دەرەوەی پێست ئیش ئەکات
5)کرێم زوتر بەئاو لائەچێت

## مەڵحەم Ointment

1)نزیکەی ٪80 لە ڕۆن پێکهاتووە
2)چڕی زۆرە و بەئاسانی بڵاونابێتەوە بە ناوچەیەکی فراواندا
3)درەنگ وشك ئەبێتە باشتر وایە بۆ پێستی وشك بەکاربهێنرێت چونکە چەورە واتا لەسەر پێست ئەمێنێتەوە و بەئاسانی هەڵنامژرێت
4)بەکاریەت بۆ پێست و
ڕوکاری ناوەوەی لەش ( ناو دەم و پێڵوی چاو )
5)مەڵحەم هەڵدەمژێت بۆ چینەکانی تری ژێرەوەی پێست
6)مەڵحەم درەنگتر بە ئاو لائەچێت چونکە چەورترە



## Differences between ampule and vial

## جیاوازی نێوان ئەمپول و ڤیاڵ




### Ampule

هەموو ئەمپولێك گیراوەیە **Solution**

وە ئەمپولیش هەیە **powder** ی تیایە بەڵام زۆر بە دەگمەن

نموونە: دەرمانی **Hydralazine** ئەمپولە بەڵام **powder** ی تیایە.




### Vial

هەموو ڤیاڵێك تۆزە **powder**

وە ڤیاڵیش هەیە گیراوەیە **solution** بەڵام زۆر بەدەگمەن

نموونە: **Keppra** , **Amikacin** , **Heparin**

ئەم دەرمانانە ڤیاڵن و گیراوەشن **Solution**



# کورتکراوەی بنچینەکانی دەرمان

## چۆنێتی ئامادەکردنی ئەمپول

**Equipment:**
1)Ampule of Medication
2)Gloves
3)Sterile Syringe
4)Gauze or Cotton
5)Medication Record

### 1. Breaking the Ampule:




دەستەکانت بشۆ و پاکی بکەرەوە. سابوون و پاککەرەوەی دەست بەکاربهێنە بۆ ئەوەی دڵنیا بیت لەوەی دەستەکانت پاکن پێش ئەوەی مامەڵە لەگەڵ ئەمپولەکەدا بکەیت. ئەگەر دەستکێشی بێ پاودەرت هەیە بەکاریبهێنە.




دڵنیابە کە هەموو شلەکە لە خوارەوەی بەشە باریکەکەی ئەمپولەکەوەیە لەو شوێنەی کە دەیشکێنیت ئەگەر هەندێك لە شلەکە لەسەرەوەی شوێنی شکانەکە بوو بە نەرمی لەسەرەوەی ئەمپولەکە بدە هەتا شلەکە بەرەو خوارەوە بڕوات.



## چۆنێتی ئامادەکردنی ئەمپول

### 1. Breaking the Ampule:




بە گۆز یان پارچە لۆکەیەك سەری ئەمپولەکە بگرە بۆ ئەوەی شوشە نەچێتە دەستتەوە کاتێ سەری ئەمپولەکە ئەشکێنی.
نیوەی سەرەوەی ئەمپولەکە ئەبێت لە دەستی زاڵی تۆدا بێت و نیوەی خوارەوەی ئەبێت لە دەستی نازاڵی تۆدا بێت.
ئەگەر خاڵێکی ڕەنگاوڕەنگ لەسەر نیوەی سەرەوەی ئەمپولەکە هەبێت ئەمە خاڵی فشارە پێویستە پەنجەی دەستی زاڵت ڕاستەوخۆ لەسەر ئەم خاڵە دابنێیت.




خوارەوەی ئەمپولەکە بگرە و سەری ئەمپولەکە بۆ لای خۆت ڕابکێشە.



# کورتکراوەی بنچینەکانی دەرمان

## چۆنێتی ئامادەکردنی ئەمپول

### 1. Breaking the Ampule:




سەری ئەمپولەکە فڕێبە

## چەند تێبینییەك

پێش ئەوەی ئەمپولەکە حازر بکەی بزانە ماوەکەی بەسەرچوە یان نا

بزانە ئەمپولەکە بە چ ڕێگایەك ئەکرێت SC,IM,IV

ئەگەر سەری ئەمپولەکەت شکان و لەگەڵ شکاندنەکە پارچە شوشەی لەگەڵ هات ئەوا پێویستە دەرمانەکە فڕێبدەی چونکە لەوانەیە هەندێك پارچە شوشە کەوتبێتە ناو ئەمپولەکە

ئەگەر ئەمپولەکە 10CC بێت ئەبێت سرنجەکەش سرنجێکی 10CC بێت



## چۆنێتی ئامادەکردنی ئەمپول

### 2. Withdrawing Solution from the Ampule




دەرزییەکە بخەرە ناو ئەمپولەکە بەبێ ئەوەی دەستت بەر لێواری سەری ئەمپولەکە و نیدڵی سرنجەکە بکەوێ.




گیراوەکە لەناو ئەمپولەکە دەربهێنە. بۆ ئەوەی تەواوی دەرمانەکە لەناو ئەمپولەکە نەمێنێتەوە، هەوڵبدە بەهێواشی دەرمانەکە دەربهێنی.




شوشەی ئەمپولەکە فڕێ بدە ناو شوێنی پاشماوەی پزیشکی.



# کورتکراوەی بنچینەکانی دەرمان

## چۆنێتی ئامادەکردنی ئەمپول

### 2. Withdrawing Solution from the Ampule




نابێت هیچ بڵقێکی هەوا لە سرنجەکە بمێنێتەوە.
بە پەنجە چەند جارێك لە سرنجەکە بە بۆ ئەوەی بڵقی هەواکان بچنە سەرەوە و پاشان پاڵ بە سەری سرنجەکەوە بنێ بۆ ئەوەی هەواکەی بێتە دەرەوە.




سرنج و نیدڵەکە فڕێبە ناو بۆکسی تیژ **Sharp Box** ( ئەو بۆکسەیە کە ئەو شتانەی تیژن وەك نیدڵ ئەکرێنە ناو ئەم بۆکسە بۆ ئەوەی زیان بەکەس نەگەیەنێت.



# کورتکراوەی بنچینەکانی دەرمان

## چۆنێتی ئامادەکردنی ڤیاڵ

**Equipment :**
**Vial of Medication**
**Gloves**
**Sterile Syringe**
**Gauze or Cotton**
**Medication Record**




1.دەستەکانت بشۆ
2.دەستکێش لە دەست بکە
3.سەیری ڤیاڵەکە بکە بزانە بەسەرچووە یان نا، وە بەکام ڕێگا ئەدرێت بە نەخۆش
4.ئەو ڤیالانەی کە ئاوی تەعقیمکراویان لەگەڵە ئەگەر ئاوە تەعقیمکراوەکە 10CC بێت ئەوە ئەبێت سرنجەکەش 10CC بێت
5.لە دوایی ئەوەی ئاوە تەعقیمکراوەکەت سەحب کرد هەوای سرنجەکە دەرمەهێنە
6.سەری ڤیاڵەکە بکەرەوە بەلام دوای ئەوەی سەری ڤیاڵەکەت کردەوە بەهیچ شێوەیەك دەست لەناوەڕاستی سەری ڤیاڵەکە مەدە
7.نیدڵەکە بخەرە ناو ڤیاڵەکە و ئاوە تەعقیمکراوەکەی تێبکە
8.تێکەڵکردنی ئاوەکە لەگەڵ ڤیاڵەکە پێی ئەوترێت Dilution or Reconstitution
9.دواتر ڤیاڵەکە لەناو دەستت بسوڕێنەوە بەلام ڤیاڵەکە ڕامەوەشێنە وا باسکراوە کە ئەو دەمارنە بەشێکی پێکهاتەکەی تێکئەچێت بە ڕاوەشاندنی زۆر
10.دوای ئەوەی دەرمانەکە هەمووی تەخفیف Dilution بوو دەرمانەکە سەحب بکە واتە دەریبهێنە
11.لەکۆتاییدا بڵەقە هەواییەکانی ناو سرنجەکە دەریبهێنە بەلام نابێت دەرمانەکە زۆر بڕژێت لەکاتی هەوا دەرکردنەکە چونکە دۆزەکەی تێکئەچێت



# کورتکراوەی بنچینەکانی دەرمان

## Routes For Administering Medication

## ڕێگاکانی وەرگرتنی دەرمان

**Oral Route** **Topical Route** **Parenteral Route** **Pulmonary Route**

**Out of Intestine or**
**Out of Alimentary**

**Otic**
- Topical
- Intracochlear
- Intratympanic

**Nasal**
- Drops
- Sprays

**Rectal/vaginal**
- Suppositories
- Gel
- Tablets
- Ointments
- Pessaries

Suppository

**Injections**
- Intravenous
- Intramuscular
- Subcutaneous
- Intra-arterial
- Intrathecal

Vein

**Ocular**
- Drops
- Ointments
- Implants
- Inserts
- Contact lens

**Oral**
- Tablets
- Capsules
- Thin films
- Syrups
- Solutions...

**Inhalational**
- Dry powders
- Liquid sprays
- Aerosols

**Topical/transdermal**
- Ointments
- Gel
- Cremes
- Patches
- Microneedles

Ointment
Skin



**2024**

# کورتکراوەی بنچینەکانی دەرمان

## Routes For Administering Medication

## ڕێگاکانی وەرگرتنی دەرمان

## Administrate in: Oral Route

| | |
|---|---|
| ئەبێت نەخۆش توانای قوتدانی دەرمانی هەبێت | Oral Route |
| ناردنی دەرمان لەڕێگەی بۆری ڕیخۆڵە | Enteral Route |
| دانانی دەرمان لە ژێر زمان | Sublingual Administration |
| دانانی دەرمان لە نێوان ڕومەت و پوك | Buccal Administration |

## 1) Oral Route

ئەم جۆرە ڕێگایە بەکاریەت بۆ قوتدانی درمان دەرمانەکان لە گەدە **Stomach** و ڕیخۆڵە باریکە **Small Intestine** هەڵئەمژرێن .
وەرگرتنی دەرمان لە ریگای قوتدانەوە کاریگەرییەکەی هێواشترە بە بەراورد بە ڕێگاکانی تر.

### سودەکانی

1) باوترین ڕێگایە
2) سەلامەتە
3) قوتدانی ئاسان و گونجاوە
4) بێ ئازارە
5) ئەتوانیت خۆت بەکاریبهێنێت
6) پێویست بە تەعقیمکردن ناکات

### زیانەکانی

1) کاریگەری خاو
2) تێکەڵاوبونی خواردن و دەرمان
3) هیچ هەڵمژینی تەواو نییە
4) کاریگەرییەکی زۆر خاوی هەیە بۆ حاڵەتە فریاکەوتنەکان
5) هەندێك دەرمان تامیان ناخۆشە
6) ناتوانرێت بۆ نەخۆشێکی بێهۆش بەکاربهێنرێت
7) بۆ نەخۆشێك گونجاو نییە کە ڕشانەوە و سکچوونی هەبێت



# کورتکراوەی بنچینەکانی دەرمان

## Routes For Administering Medication

## ڕێگاکانی وەرگرتنی دەرمان

## 1) Oral Route



ئەم شێوەی دەرمانانە لە ڕێگای دەمەوە وەرئەگیرێن:

| | |
|---|---|
| حەب | Tablet |
| کەپسول | Capsule |
| شروب ( تۆز و گیراوە ) | Syrup |
| پاودەر | Powder |
| قەترە | Drop |

هەنێك كەس لەكاتی خواردنی حەبدا ئاو بەكارناهێنن و وا هەست ئەكەن ئاویان پێوسیت نییە بۆ ئەوەی پاڵ بە حەبەكەوە بنێن بۆ گەدە بەڵام ئەم بیركردنەوەیە هەڵەیە.

### سودەکانی خواردنی حەب لەگەڵ ئاو

بەپێی توێژینەوە زانستییەکان دەرکەوتووە ئاو هۆکارێکی سەرەکییە بۆ کەمکردنەوەی زیانەکانی دەرمان لەسەر کۆئەندامی هەرس هەروەها یارمەتی ڕۆیشتنی دەرمان ئەدات بەناو قورگ و سورێنچکدا و بەو شێوەیە ئەگاتە گەدە و ئاو ئەبێتە هۆی کەمبوونەوەی ترشی گەدە و خەستی حەب ئەمەش وا ئەکات زیانی کەمتر بێت لەسەر دیواری کۆئەندامی هەرس.

### زیانەکانی خواردنی حەب بەبێ ئاو

بەکارنەهێانی ئاو لەگەڵ خواردنی حەبدا ئەتوانێت توشی هەوکردنی دیواری گەدەت بکات و ترشەڵۆك و دڵەکزێ **Heart Burn** دروست بکات ئەگەر بەردەوام بیت لەسەر بەکارنەهێانی ئاو لەگەڵ حەبدا ئەوا توشی برینی گەدە و هەوکردنی درێژخایەن ئەبیت.



2024

# کورتکراوەی بنچینەکانی دەرمان

## Routes For Administering Medication

## ڕێگاکانی وەرگرتنی دەرمان

## 1) Oral Route

ئەگەر نەخۆشێك توشی ڕشانەوە بوو یان ڕەتیکردەوە کە دەرمانەکە بخوات لەم حاڵەتەدا پێویستە چی بکەیت؟

1) ئەگەر نەخۆشەکە ڕەتیکردەوە کە دەرمانەکە بخوات ئەوا نابێت دەرمانەکەی پێبەی بەڵکو لەم حاڵەتەدا ئەبێت سەروی خۆت ئاگادار بکەیتەوە و پێی بڵێی کە دەرمانەکەم یاوە بە نەخۆشەکە بەڵام ڕەتکردۆتەوە بیخوات.

2) ئەگەر نەخۆشەکە توشی ڕشانەوە بوو وە کاتێك حەبەکەت پێیا و دوبارە ڕشایەوە ئەوا حەبێکی تری پێمەیە لەم حاڵەتەدا ئەبێت سەروی خۆت ئاگادار بکەیتەوە و پێی بڵێی کە دەرمانەکەم یاوە بە نەخۆشەکە بەڵام ڕشاوەتەوە.

### کە نەخۆشێك حەبێکی بۆ نوسرابێت چۆن پێی بدەین؟

فایلی نەخۆشەکە بپشکنە و پێداویستییەکان ئامادە بکە:

1. Gloves
2. Medication
3. Glass of water
4. PEE in need
5. Medication in disposable cup or oral syringe
6. Tab Crasher

دەرمانەکە بخەرە ناو **Cap** ەکە ( سەری قتوی دەرمانەکە ) پاشان بە نەخۆشەکەی بە و پێی بڵێ کە بیخوات دواتر پەرداخێك ئاوی بەرێ بۆ ئەوەی لەگەڵ دەرمانەکە بیخوات لەکۆتاییدا تۆماری بکە لە **Medication Chart** ەکە کە دەرمانەکەت یاوە بە نەخۆشەکە.



# کورتکراوەی بنچینەکانی دەرمان

## Routes For Administering Medication

## ڕێگاکانی وەرگرتنی دەرمان

## 1) Oral Route

ئەگەر نەخۆشەکە حەساسێتی( Allergy ) بەو دەرمانە هەبوو ئەوا دەرمانەکە پێ مەیە بەڵام ئەگەر دواى ئەوەی دەرمانەکەت پێدا و توشی حەساسێت بوو ئەوا سەروی خۆت ئاگادار بکەرەوە.



## نیشانەکانی Allergy

1) سوربونەوە Redness
2) خوران Itchy
3) لیر Hives
4) هەناسەدانی خێرا Tachypnea





# Routes For Administering Medication

## ڕێگاکانی وەرگرتنی دەرمان

## 1) Oral Route

### Enteral Route

ئەگەر کەسێك توانای قوتدانی یان ئارەزوی خواردنی نەبێت ئەوا لەڕێگەی NG Tube دەرمانەکەت پێ ئەدەین.

## NG Tube چییە؟

Nasogastric Tube سۆندەیەکی لاستیکیە بەکاریەت بۆ ئەو نەخۆشانەی کە توانای قوتدانیان نییە، سۆندەکە لە لوتەوە بۆ نەخۆشەکە دائەنرێ بۆ ناو گەدە.




### ئەم سۆندەیە بەکاریەت بۆ :

1. پێدانی خواردن
2. پێدانی دەرمان
3. کەسێك ئارەزووی خواردنی نەبێت
4. کەسێك بێهۆش بێت
5. گیرانی سورێنچك
6. ئەو کەسانەی نەشتەرگەری ناو دەمیان بۆ کراوە
7. دەرهێنانی نمونەیەك لە پێکهاتەکانی بۆ شیکردنەوە
8. بۆ لابردنی خوێن لە گەدە
9. بۆ شتنی گەدە



# کورتکراوەی بنچینەکانی دەرمان

## Routes For Administering Medication

## ڕێگاکانی وەرگرتنی دەرمان

# 1) Oral Route

## Enteral Route

### مەترسییەکانی دانانی سۆندەی لوت و گەدە ( Nasogastric Tube) چین؟

ئەگەر NG Tube بە باشی نەخرێتە ناوەوە، ئەوا دەتوانێت شانەکانی ناو لووت و جیوبەکان و قوڕگ و سورێنچك یان گەدە بریندار بکات. هەر لەبەر ئەمەشە کە دانانی NG Tube پشکنین ئەکرێت و پشتڕاست ئەکرێتەوە کە لە گەدە دایە پێش ئەوەی هەر کردارێکی تر ئەنجام بدرێت.

### هەروەها خۆراکپێدانی NG Tube ئەتوانێت ببێتە هۆی:

| | |
|---|---|
| 1. گرژبونی سك | Abdominal Cramping |
| 2. ئاوسانی سك | Abdominal Swelling |
| 3. سکچون | Diarrhea |
| 4. هێڵنجدان | Nausea |
| 5. ڕشانەوە | Vomiting |
| 6. هەڵهێنانەوەی خواردن یان دەرمان | Regurgitation of food or medication |






## Routes For Administering Medication

## ڕێگاکانی وەرگرتنی دەرمان

# 1) Oral Route

## Sublingual and Buccal Administration

پێدانی دەرمان لەڕێگای ژێر زمان و ژێر ڕومەت دوو ڕێگای جیاوازن بۆ پێدانی دەرمان لەڕێگەی دەمەوە. ڕومەت و ژێر زمان ژمارەیەکی زۆر مولولەی خوێنیان تێدایە ئەمەش ئەبێتە هۆی ئەوەی دەرمانەکان ڕاستەوخۆ بچنە ناو خوێنەوە بێ ئەوەی بە کۆئەندامی هەرسدا تێپەڕبێت.

پێدانی دەرمان لەڕێگای ژێر زمانەوە (**Sublingual Administration** ): لەم ڕێگایەدا دەرمانەکە ئەخەینە ژێر زمانەوە بۆ ئەوەی بتوێتەوە و پاشان هەڵبمژرێت بۆ ناو خوێن لەلایەن ئەو شانانەی کە لەژێر زمانەوەن.

پێدانی دەرمان لەڕێگای ڕومەت (**Buccal Administration** ): بریتیە لە دانانی دەرمانێك لەنێوان ڕومەت و پوك پاشان ئەتوێتەوە و هەڵئەمژرێت بۆ ناو خوێن.




شێوەی ئەو دەرمانانەی کە لە ڕێگای ژێر زمان و ژێر ڕومەت وەرئەگیرێن:

Tablet (1

Caplet (2

Spray (3



# کورتکراوەی بنچینەکانی دەرمان

## Routes For Administering Medication

## 1) Oral Route ڕێگاکانی وەرگرتنی دەرمان

### Sublingual and Buccal Administration

دکتۆر لەوانەیە دەرمانی ژێر زمان و ژێر ڕومەتت بۆ بنوسێت لە ژێر یەکێك لەم حاڵەتانەی خوارەوە:

1. دەرمانەکە پێویستە بە خێرایی بچێتە ناو سیستەمەکەتەوە واتە خوێن
2. ئەگەر کەسەکە کێشەی قووتدانی دەرمانی هەبێت
3. دەرمانەکە زۆر بە باشی لە گەدەدا هەڵنەمژرێت
4. کاریگەرییەکانی دەرمانەکە بەهۆی هەرسکردنەوە کەم ببێتەوە

### سودەکانی

1. دەرمانەکە بە خێرایی هەڵدەمژرێت
2. ئەتوانێت لە کاتی فریاگوزاریدا گرنگ بێت کاتێك پێویستت بە دەرمانەکە ئەبێت بۆ ئەوەی یەکسەر کار بکات، وەك لە کاتی جەڵتەی دڵدا.
3. پێویست ناکات دەرمانەکە قووت بدەیت. ئەو دەرمانانەی کە لە ژێر زمان یان لە نێوان ڕومەت و پوکدا هەڵدەمژرێن، بۆ ئەو کەسانەی کە کێشەی قووتدانی حەبیان هەیە، ئاسانترە بۆ خواردن.
4. ئەم دەرمانانە بە سیستەمی هەرسدا ناڕۆن، بۆیە لە ڕێگەی جگەرتەوە مێتابۆلیز ناکرێن واتە شیناکرێنەوە. ئەمەش واتە لەوانەیە بتوانیت ژەمی کەمتر وەربگریت و هێشتا هەمان ئەنجام بەدەست بهێنیت.

### زیانەکانی

هەروەها دەرمانی ژێر زمان و دەم هەندێك زیانیان هەیە. خواردن، خواردنەوە، یان جگەرەکێشان، کاریگەری لەسەر چۆنیەتی هەڵمژینی دەرمانەکە و باش کارکردنی ئەبێت.



## Routes For Administering Medication

ڕێگاکانی وەرگرتنی دەرمان

# 2) Topical Route

| | |
|---|---|
| **Topical Route** | **Applying drug on to skin or mucous membrane:** |
| Vaginal Administration | Vagina |
| Rectal Administration | Rectum |
| Inunction | Rubbing drug into skin |
| Instillation | Placing drug into direct contact with mucous membrane |
| Irrigation | Flushing mucous membrane with drug in solution |
| Skin application | Applying transdermal patch |







# Routes For Administering Medication

## ڕێگاکانی وەرگرتنی دەرمان

## 2) Topical Route

### 1. Vaginal Administration

پێدانی دەرمان لە ریگای ئەندامی زاوزێی مێینەوە

لەمێیەدا دەرمانەکان لە ڕێگای **vaginal opening** ەوە ئەدرێت بە نەخۆش

تێبینی/ لە ئەندامی زاوزێی نێرەدا **urethra opening** هەیە بەڵام **Vaginal opening** بونی نییە

سێ شێوەی دەرمانمان هەیە کە لە Vaginal ئەدرێت:

1) **Suppository**
2) **Tablet**
3) **Cream**






# کورتکراوەی بنچینەکانی دەرمان

## Routes For Administering Medication

## ڕێگاکانی وەرگرتنی دەرمان

## 2) Topical Route

### 1. Vaginal Administration

**Vaginal Suppository:**

تەحامیلی کۆئەندامی زاوزێی مێینە بریتییە لەو دەرمانە ڕەقە کە بە ئامێری تایبەتی بەکارهێنراو ئەخرێتە ناو زێی نەخۆشەکە. جەستە بە خێرایی دەرمانەکان لە چەورییەکانی کۆئەندامی زاوزێ مێینە هەڵدەمژێت. خێراتر کارئەکەن لەو دەرمانانەی کە بە دەم ئەخورێن. ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە تەحامیلەکان لەناو جەستەدا ئەتوێنەوە و ڕاستەوخۆ ئەچنە ناو خوێنەوە.

(تەحامیل واتە شاف)

### چۆنێتی بەکارهێنانی تەحامیل(شاف)

ئافرەت ئەتوانێ خۆی **Suppository** تەحامیل بۆخۆی دابنێ. بەڵام ئەگەر بێهۆشبوو یان نەیتوانی ئەوا ئەبێت کەسێك بۆی دابنێت.

## Procedure



1) **Equipment (Suppository - applicator - Gauze - Medication Record)**
2) **Wash your hand and vaginal area, and dry well with a clean towel.**
3) **Remove any wrapping from the suppository.**



4) **Place the suppository onto the end of the applicator.**
5) **Hold the applicator by the end that does not contain the suppository.**



# 2) Topical Route

## 1. Vaginal Administration

### Vaginal Suppository:

### Procedure

6) Get into position. delivery position
7) Clean the vaginal with a Gauze.
8) Gently insert the applicator into the vagina as far as it will comfortably go.
9) Press the applicator's plunger as far as it goes. This will push the suppository far back into your vagina.
10) Remove the applicator from your vagina.
11) Wash your hands.

### Vaginal Cream

### Equipments

1) Medication with applicator, if appropriate
2) Water-soluble lubricant
3) Perineal pad
4) Washcloth, skin cleanser, and warm water
5) Gloves
6) Gauze
7) PPE, in Need
8) Administration Record (MAR)



## Routes For Administering Medication

ڕێگاکانی وەرگرتنی دەرمان

# 2) Topical Route

## 1. Vaginal Administration

### Vaginal Cream

**How to Apply Vaginal Cream**


















# کورتکراوەی بنچینەکانی دەرمان

## Routes For Administering Medication

## ڕێگاکانی وەرگرتنی دەرمان

## 2) Topical Route

### 1. Vaginal Administration

### Vaginal Tab Administration

1. کۆئەندامی زاوزێی مێینە پاك ئەکەیتەوە بە **Gauze**
2. تابەکە ئەخەیتە سەر **Tab Holder** و پاشان سەری **Tab Holder** ەکە بە **Lidocaine** چەور ئەکەیت
3. دواتر **Tab Holder** ەکە ئەخەیتە ناو **Vaginal Opening** و پاڵ بەسەری **Tab Holder** ەکەوە ئەنێیت بۆ ئەوەی تابەکە بچێتە ژورەوە
4. دوای ئەوەی تابەکەت خستە ژورەوە **Tab Holder** ەکە ئەهێنیتە دەرەوە
5. پاشان تۆماری ئەکەیت لەسەر **Medication Chart**

### تێبینییەکی گرنگ

- لە حاڵەتێکدا ئەگەر کچەکە هاوسەرگیری نەکردبو ئەوا دەرمانەکە لە ڕێگەی زێیەوە نادرێت.



Routes For Administering Medication

ڕێگاکانی وەرگرتنی دەرمان

# 2) Topical Route

## 2. Rectal Administration

پێدانی دەرمان لە ڕێگای دەرچەی کۆم **Rectal Canal**

شێوەی ئەو دەرمانەی کە لە دەرچەی کۆمەوە **Rectal Canal** بەکارئەهێنرێت:

1. تەحامیل (شاف)

ئەبێت تەحامیل ( **Suppository** ) لە ژێر 25 پلەی سیلیزیدا هەڵبگیرێت بۆ ئەوەی دەرمانەکە تۆزێك ڕەق بێت بۆ ئەوەی ئاسانتر ڕەوانەی دەرچەی کۆم بکرێت (**easy to insertion** ).





## Routes For Administering Medication

# ڕێگاکانی وەرگرتنی دەرمان

# 2) Topical Route

## 2. Rectal Administration

پێدانی دەرمان لە ڕێگای دەرچەی کۆم **Rectal Canal**

## Procedure

1. فایلی نەخۆشەکە چێك بکەرەوە
2. ئامێرەکان:
1) شاف (تەحامیل )
2) جێڵی لیدۆکاین
3) دەستکێش
4) گۆز
3. دەست شتن
4. خۆناساندن بە نەخۆشەکە
5. پشتڕاستکردنەوە
(بزانە ئەم کەسە ئەوەیە کە پێویستە کردارەکەی بۆ ئەنجام بدرێت )
6. ڕێکارەکە بۆ نەخۆشەکە ڕوون بکەرەوە
7. داوا لە نەخۆشەکە بکە بکەوێتە سەر لای ڕاست یان چەپ **lateral position** (**Right or Left position**)
بەڵام ئەگەر نەخۆشەکە بێ هۆشبوو ئەوا ئەبێت خۆت بیخەیتە سەر لایەك
8. ئەگەر کەسەکە ئاگای لەخۆی بێت داوای لێبکە قاچێکی بنوشتێنێتەوە **Flex**پاشان هەناسەیەکی قوڵ هەڵبمژێت بەڵام ئەگەر کەسەکە ئاگای لەخۆی نەبو ئەوا ئەبێت خۆت قاچێکی بنوشتێنیتەوە.



# کورتکراوەی بنچینەکانی دەرمان

## Routes For Administering Medication

## ڕێگاکانی وەرگرتنی دەرمان

# 2) Topical Route

## 2. Rectal Administration

پێدانی دەرمان لە ڕێگای دەرچەی کۆم **Rectal Canal**

## Procedure

9. سەیری **Rectal** بکە بزانە هیچ پیسیەکی پێوەیە چونکە ئەگەر نەخۆشەکە لەباری بێ هۆشیدا بێت ناتوانێت خۆی پاك بکاتەوە بۆیە ئەگەر پیسیەکی پێوە بو بە گۆز **Gauze** پاکی بکەرەوە
10. پاشان هەندێك **Lidocaine** بکەرە سەر پشتی دەستت
11. دواتر **Suppository** ەکە دەربێنە و سەری **Suppository** ەکە بە **Lidocaine** چەور بکە
12. تەحامیلیەکە (شاف) ڕەوانەی **Rectal** بکەو لەگەڵ تەحامیلەکەدا 2**inches** هەتا 3**inches** پەنجەی **index** ببەرە ژورەوە
13. لە کۆتاییدا نەخۆشەکە داپۆشە و کردارەکە بنوسە لە **Medication chart**

تێبینی: ئەگەر نەخۆشێك سکچونی هەبێت نابێت تەحامیلی بۆ دابنرێت

ئەگەر ویستت تەحامیل (شاف) بۆ منداڵ دابنێیت، یەکەمجار لەسەر ڕانی خۆتی دابنێ ئەبێت منداڵەکەش بخەیتە سەر سك ئینجا شافەکەی بۆ دابنێ.



# ڕێگاکانی وەرگرتنی دەرمان

## 2) Topical Route

### 3. Inunction

بەکارهێنانی کریم یان مەڵحەم لەسەر پێست

شێوەی ئەو دەرمانانەی کە لەسەر پێست بەکارئەهێنرێن:

1. Jel 2. Cream 3. Ointment 4. Lotion

چۆنێتی بەکارهێنانی کریم یان مەڵحەم لەسەر پێست

1. پێستەکە بشۆ یان پاکی بکەرەوە پێش ئەوەی کریم یان مەڵحەمی لێبەی
2. کە کریمەکە یان مەڵحەمەکەت لە دەست یا مەساج بۆ شوێنەکە بکە و چینێکی تەنك دروست بکە
3. کاتێك بۆ جاری دووەم کریمەکە یان مەڵحەمەکەی لێ ئەیەی پێویستە ئەو شوێنەی کە مەڵحەمەکە یان کریمەکەت لێ یاوە بیشۆیت ئینجا کریم یان مەڵحەمی لێ بەی

بەلێدانی چینێکی زۆر ئەم حاڵەتانە ڕوئەدات

ژەهراویبون

کەم هەڵمژین

کەمی هەواگۆرکێ



# ڕێگاکانی وەرگرتنی دەرمان

# 2) Topical Route

## 4. Instillation

### Instillation بۆ چ شوێنێك ئەکرێت؟

1) چاو Eye
2) گوێ Ear

## Ear Drop

1. ئەگەر ویستت قەترەکە بکەیتە گوێی ڕاست ئەوە نەخۆشەکە ئەخەیتە سەر لای چەپ بۆ ئەوەی قەترەکە بچێتە گوێی
2. پاشان سەیری گوێی نەخۆشەکە ئەکەین بزانین هیچ پیسیەکی پێوەیە یان نا ئەگەر پێوەیبوو ئەوا پاکی ئەکەینەوە
3. ئەگەر نەخۆشەکە کەسێکی پێگەیشتوو بوو ئەوا گوێی ڕائەکێشین بۆ دواوە و بۆ سەرەوە بەڵام ئەگەر منداڵ بو گوێی ڕائەکێشین بۆ دواوە پاشان بۆ خوارەوە



How to Instill Ear Drops in Adults



How to Instill Ear Drops in Children



# 2) Topical Route

## 4. Instillation

دڕۆپەکە ئەکەینە سەر **Exit Canal** واتا لاکانی گوێ دواتر دوو بۆ سێ جار پەستان ئەخەینە سەر **tragus**









# کورتکراوەی بنچینەکانی دەرمان

## Routes For Administering Medication

ڕێگاکانی وەرگرتنی دەرمان

## 2) Topical Route

### 4. Instillation

**Eye Drop**

تێکردنی قەترە یان مەڵحەمی چاو

1. سەرەتا چاوی نەخۆشەکە پاك ئەکەینەوە ئەگەر هەر پیسییەکی تیا بێت
2. ئەگەر مەڵحەم بوو ئەوا پێڵوی چاوی ڕائەکێشین و مەڵحەمەکە لە ناوەوە بۆ دەرەوە تێی ئەکەین بەڵام ئەگەر قەترە بوو تەنها لەناوەوە قەترەی تێئەکەین
3. دوای ئەوە کە قەترەکە یان مەڵحەمەکەمان تێکرد دوا لە نەخۆشەکە ئەکەین چاوی دابخات و کەمێك پەستانی بخاتە سەر و نەیخورێنێت







How to instill eye drops

تێبینی: ئەگەر دوو قەترەمان هەبوو پێوسیتە 5دەقە ماوەیان هەبێت
ئەگەر قەترەیەك و مەڵحەمێکمان هەبوو ئەوا یەکەمجار قەترەکە ئەیەین بە نەخۆشەکە پاشان مەڵحەمەکە
ئەگەر نەخۆشەکە بە دانیشتنەوە بوو پێش ئەوەی مەڵحەمەکە یان قەترەکەی بۆ تێبکەین سەری بەرز ئەکەینەوە بۆ دواوە



# کورتکراوەی بنچینەکانی دەرمان

## Routes For Administering Medication

## ڕێگاکانی وەرگرتنی دەرمان

## 2) Topical Route

### 5. Irrigation

**Irrigation** واتا شتن

شتن بۆ ئەم شوێنانە ئەکرێت

1)گوێ 2)چاو 3)لوت 4)گەدە 5)کۆم

### ئەو ئاوەی بۆ شتن بەکاریەت

1. **Normal Saline**
2. **Distal Water** زیاتر بەکاریەت

( **Toomey Syringe or Irrigation Syringe**) بەکاریەت بۆ شتنی( گوێ - لوت - چاو )

لە دوو حاڵەتدا لوت ئەشۆین:

نەشتەرگەری

جیوب

### مەبەست لە بەکارهێنانی

1. بۆ ئەوانەی نەشتەرگەری ناوبینین **endoscopy** ئەکەن
2. ئەوانەی تیشکی ناو سك **X-ray for bowel** ئەگرن
3. ئەوانەی نەشتەرگەری کرانەوەی سکیان بۆ ئەکرێت
4. بۆ چارەسەری قەبزی توند

کاتێك نەخۆشێك توشی قەبزی ئەبێت ئەوکاتە **enema** بەکارئەهێنرێت



# کورتکراوەی بنچینەکانی دەرمان

## Routes For Administering Medication

ڕێگاکانی وەرگرتنی دەرمان

## 2) Topical Route

### 5. Irrigation

| هەنگاوەکان | پێداویستیەکان |
|---|---|
| ڕونکردنەوەی کردارەکان بۆ نەخۆش<br>شتنی دەست و پاریزگاری کردن لە کەسایەتی نەخۆش<br>دانانی پارچەیەك قوماشێك لەژێر نەخۆشەکە و پاڵکەوتنی لەسەر لای چەپ<br>دانانی جێڵەکە لەسەر کاسیتەرەکە و تێکردنی بەشێوەیەکی هێواش<br>تێکردنی دەرمانەکە و داخستنی بۆ ماوەی 5 دەقە<br>پاشان کردنەوەی و هێنانە دەرەوەی کاسیتەرەکە<br>شتنی دەست<br>نوسینی کردارەکە لە فایلی نەخۆش | کاسیتەری کۆم<br>جێڵی نەرمکەرەوە<br>**Normal Saline**<br>دەرمانی دیاریکراو<br>**Kidney dish**<br>کلێنس<br>**Toomey Syringe** |



2024

# کورتکراوەی بنچینەکانی دەرمان

## Routes For Administering Medication

## ڕێگاکانی وەرگرتنی دەرمان

## 2) Topical Route

### 6. Skin application

لەزگەی پێست بریتییە لە لەزگەیەك کە بە پێستەوە ئەنوسێت و دەرمانی تێدایە ئەو دەرمانەی لە لەزگەکەدا هەیە بۆ ماوەیەك لە جەستەدا هەڵئەمژرێت.

### لەزگەی پێست بۆ چ مەبەستێك بەکارئەهێنرێت

لەزگەی پێست بەکارئەهێنرێت بۆ گەیاندنی کۆمەڵێك دەرمان بۆ ناو جەستە. هەندێك لەو دەرمانانەی کە زیاتر لە لەزگەی پێستدا بەکارئەهێنرێن بریتین لە:

- **Fentanyl** بۆ کەمکردنەوەی ئازار
- **Nicotine** بۆ یارمەتیدان لە وازهێنان لە جگەرەکێشان
- **Clonidine** بۆ چارەسەرکردنی بەرزی پەستانی خوێن

### شوێنەکانی دانانی لەزگەی پێست




تێبینی:
نابێت لەزگەی پێست لەو شوێنانە بدرێ کە سوتاوە یان بریندارە
لەزگەی پێست ئاسانە بۆ بەکارهێنان بەڵام بۆ ئەوەی بە باشی کاربکات پێویستە بە شێوەیەکی گونجاو بەکاربهێنرێت



# کورتکراوەی پێچینەکانی دەرمان

شێوازەکانی وەرگرتنی دەرمان چوار جۆری سەرەکییە هەر جۆرێکیش چەن ڕێگایەکی هەیە بەڵام من لەم کتێبەدا باسی دو جۆرم نەکردووە کە بریتین لە **Parenteral** و **Pulmonary** چونکە ئەم دوو شێوەیە زیاتر پەیوەندییان هەیە بە کاری پەرستارییەوە ئەگەر خوای گەورە ویستی لەسەر بێت ڕەنگە لە داهاتوودا کتێبێکی تایبەت بە کارەکانی پەرستار بنوسم بەهیوای سوود بۆ هەمووتان.

